# بوچی

## گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن ؟



وەرگێران

دیان جەمیل

ناڤێ پەرتوکێ: بوچی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن ؟
نڤیسەر:ئەندرو شارمان
وەرگێران ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
بابەت:  زانستی - گشتی
تیپچن: دیمەن جەمیل
دیزاینا ناڤەرۆکا چاپا کوردی : بێوار محەمەد
قەوارە: سم × سم
ژمارا لاپەرا:
تیراژ:
نرخ:
ژمارا راسپاردنێ:
زنجیرە و سال:  /
چاپخانە:

# بوچی

# گیانەوەر
# بەرەڤ نەمانێ دچن ؟



وەرگێران

**دیان جەمیل**

# دڤێ پەرتوکێدا
# بەرسڤا ڤان پرسیاران دێ بینی

بوچی دەیناسۆر نەماینە ل سەر ڕوویێ ئەردی ؟

ئەرێ هەمی جورێن گیانەوەران بەرەڤ نەمانێ دچن ؟

بوچی باڵندێ دودوو مری ؟

ئەو کیژ گیانەوەربوو لەشێ وی نیڤەك وەکی هەسپی و نیڤەك وەکی کەرێ بوو؟

هژمارا مێشومۆران ل سەر ڕوویێ ئەردی چەندە ؟

ئەو کیژ مێشومۆرە قەبارێ وێ هندی یێ مشکەکی و کەفیتە بەر گەفێن قڕکرنێ؟

بوچی گیانەوەر حەز ژ گومێن ئاڤێ دکەن ؟

نێچیرڤان چەوا نێچیرا تێشکێن باڵندەیان دکەن ؟

بوچی گەمی زیانێ دگەهینە چێلێن دەریایی ؟

ئەرێ هێکێن ماسیا خیبار کیڤە دچن ؟

ئەگەر تە سەمەنکلێ ئەنکلیسی دیت نەبێژە کەسێ ؟

چەوا ماسی نەخوشیان دگەهینە باڵندێ ئەڵووی ؟

ئەو کیژ گیانەوەرە شاخەك پێڤە هەی و کەفتیە بن گەفێن قڕکرنێ ؟

تو ل کیرێ دشێی وێنەیەکێ فوتۆگرافی دگەل فیلان بگری ؟

ئەو کیژ گیانەوەربوو پشتی قڕبوی دووبارە هژمارا وان زێدەبووڤە ؟

بوچی مەیمینکێن مەزن حەز ژ داران دکەن ؟

ئەو کیژ گیانەوەرێ شەرمینە کەفیتە بن گەفێن قڕکرنێ ؟

بوچی گیانەرێ یێ "ئای ئای" نەخوشیێ دگەهینتە مروان ؟

بوچی هرچا جەمسەرێ هێشتا مایە د مەترسیێ دا ؟

بوچی مروڤ فەرویێ فەقما بویاغ دکەن ؟







ئەو کیژ نەهەنگێ خودان شاخە و کەفتیە بەر گەفێن قرکرنێ ؟

بوچی مروڤ نەهەنگێ گونجای نێچیردکەن ؟

ئەرێ باخچە دناڤ دەریایان دا هەنە ؟

بوچی بەبەغا ناهێنە هژمارتن گیانەوەرێن کەهی ؟

کی دێ مارگیسکان کەتە دناڤ چانتێن خودا ؟

چەوا دێ فیل ژ نێچیرڤانان هێنە پاراستن ؟

چەوا دووپشکێن لاستیکی دهێنە گرتن ؟

بوچی پڵنگی نەڤێت مروڤ وی ببینن ؟

چەوا پڵنگ خوارنێ بۆ خو پەیدادکەت ؟

گیانەوەرێ ئوبوسوم چەوا دگەهنە هەڤالێن خو ؟

بوچی ل بەرامبەر گورێلایێ تو نەشێی بێهنژی ؟

کەنگی گیانەوەرا دڤێت بچنە باخچێن گیانەوەران ؟

کەنگی گیانەوەران دڤێت ژ باخچێ گیانەوەران بچن ؟

ئەو کیژ گیانەوەرە د مەنجەلوکاندا دهێتە ب خودانکرن ؟

بوچی گیانەوەر پێدڤی مەنە ؟

بوچی ئەم پێدڤی ب گیانەوەراینە ؟





دبیت هندەك گیانەوەر ژبەر چالاكیێن مروڤان بەرەڤ نەمانێ بچن, یانژی دبیت ژبەر گهورینا ژینگەهـ و جهێ ژیانا وان بیت.

## بوچی دەیناسوٚر نەماینە ل سەر ڕوویێ ئەردی ؟

بەری ملیار سالاٚن دەیناسوٚر ل سەر روویێ ئەردی دژیان, لێ بەری 56 ملیوٚن سالاٚ ن ب ئێكجاری قڕبو ینە و نەماینە ساخ, تانوكە كەس ب دروستاهی نزانیت كا بوچی ئەڤ گیانەوەرێن مەزن مرینە, لێ پتریا زانا دگەل هندێنە كو ل سەردەمەكی ئەرد هەمی ببوو بەستی و ئەڤ گیانەوەرە نەشیان خو ل بەر سەڕمایێ بگرن لەوڕ ا هەمیان گیانێ خو ژ دەست دایە.

## ئەرێ هەمی جورێن گیانەوەران بەرەڤ نەمانێ دچن ؟



ب شێوەیەكێ گشتی, هەمی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن, لێ ل شوینا وان هندەكێن نوو پەیدادبن, پتریا جاران گیانەوەرێن نوو تا ڕادەیەكی وەكی یێن بەرێنە بتنێ هندەك گهورین تێدا پەیدادبن, بوٚ نموونە ئەو فیلێن نوكە ل سەر روویێ ئەردی دژین وەكی وان فیلانە یێن بەری دەهـ هزار سالاٚن قڕبوین كو وان لەشێ وان ب پیرتەكێ بوش و درێژ یێ نخافتی بوو.



گەلەك گیانەوەر یێن كەفتینە بەر گەفێن قڕكرنێ ژبەركو مروڤ بەردەوام نێچیرا ڤان گیانەوەران دكەت.



دەمێ كەرەستێن كیمیایی یێن زیانبەخش دهێنە هاڤێتن بۆ ناڤ هەوایی و ئاڤێ و سەر هشكاتی، دبنە ئەگەرێ پیسكرنا ژینگەهێ، ئەڤ چەندەژی دبیتە ئەگەرێ كوشتنا گەلەك گیانەوەران.

دەمێ مروڤ دچنە دەڤەرەكا نووی بۆ ئاكنجیبونێ، دێ هندەك گیانەوەرا دگەل خو بەت، دبیت ئەڤ گیانەوەرێن دگەل وان دچن گیانەوەرێن وێ دەڤەرێ بخون.

گەلەك گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن ژبەركو مروڤ بەردەم جهێ ژینا وان خراب دكەت و كارگەهـ و پرۆژە و رێك پر و خانیان لێ دروست دكەن.





بالندێ فیل دهاته هژمارتن مەزنترین بالندە ل سەر روویێ ئەردی و هێکا وی 200 جاران ژ هێکا مریشکێ مەزنتربوو، لێ بەری 300 سالان بەرەڤ نەمانێ چوون.





# بوچی بالندێ دودوو مری ؟

هەر ژ مێژە بالندێن دودوو ل سەر گزیرتا "مۆریشوش" ئەوا دکەڤیتە سەر زەریایا هندی دژیان، لێ تا سالا 1680چ بالندە نەمانە ساخ ژبەرکو ئەو دەریاڤانێن دچوونە ڤێ گزیرتێ ئێکسەر دا ڤان بالندان نێچیرکەن و گوشتێ وان خون. بالندێن دودوو نەدشیان ب رەڤن و خو قورتال بکەن چونکی رێڤەچوونا وان یا هێدی بوو.

بالندێ دودووی هێکێن خو ل سەر ئەردی دکرن و دهێلانە وێرێ، لەورا دبوونە نێچیرەکا ب سانەهی بۆ جرد و سەیێن برسی.

# ئەو كیژ گیانەوەربوو لەشێ وی نیڤەك وەكی هەسپی و نیڤەك وەكی كەری بوو؟



ل سەردەمێ بەرێ گیانەوەرەك هەبوو دگوتنێ "كواگا" كو دناڤ دارستانێن باشورێ ئەفریقیا دژیا, لێ دەما مروڤ گەهشتینە جهێ وان و داگیركری, ئێكسەر دەست ب نێچیرا ڤان گیانەوەران كر ئەوژی ژبەر پیست و گوشتێ وان, پتریا ڤان گیانەوەران هاتنە كوشتن لەورا هەتا سالا 1883 خو ئێك ژێ نەما ساخ.

بەری پتر ژ 160سالان, گیانەوەرێ كواگا ل بەریتا بۆ هاژووتنا ئەرەبانان دهاتە ب كارئینان.





دوماهیك جار گورگێ "ساسمانیا" هاتیە دیتن بەری 70 سالان بوو, ئەڤ گیانەوەرە یێ سەیربوو چونكی سەرێ وی یێ گورگا بوو, لەشێ وی وەكی یێ پلنگان و یێ هێلداربوو, كوریا ویژی وەكی یا كەنگەران بوو.

# هژمارا مێشومۆران ل سەر روویێ ئەردی چەندە ؟



تانوکە پتر ژ ملیونەك و چوار سەد هزار جورێن مێشومۆران هاتینە دیتن کو هژمارا وان ل سەر روویێ ئەردی ژ یا هەمی بونەوەرێن دی پترە, لێ گەلەك ژڤان بونەوەران ژبەر چالاکی یێن مروڤان یێن کەفتینە بەر گەفێن ڤرکرنێ, ئەگەر مروڤ بەردەم بوو ل سەر خرابکرنا جهێ ژینگەها وان ڕەنگە گەلەکێن دیژی ژناڤ بچن.

پەلاتینکا "شاها ئەلیکساندرا" پەلاتینکەکا گەلە کێمە کو ل دەڤەرا "بابوا" ل وەلاتێ گینیا دژیت, لێ ئەو دارستانا ئەڤ پەلاتینکە لێ دژیت رۆژ بۆ روژێ یا دهێتە خرابکرن.



ژبەرکو هژمارا مێشومۆران گەلەك یا مەزنە, لەورا ئەم نەشێن چاڤدێریا هەمیان بکەین داکو ژناڤ نەچن لەورا باشترین رێك ئەوە ئەم پاراستنا وان جهان بکەین یێن ئەڤ بونەوەرە لێ دژین.





بەری نوکە کومەکا بچووك یا
مێشومۆرێن کو وەکی لسقێ خو ب
تشتانڤە دگرت ل گزیرتا "لوردهاو"
دژیان, خەلکێ وان دەڤەران دبێژن ئەڤ
بونەوەرە ل سەر گزیرتا هەرەمی Ball
Pyramid دژین کو نێزیکی
ئوسترالیایە, لێ ل ڤێ دوماهیێ کەسێ
چ ژڤان بونەوەران نەدیتینە.

# ئەو کیژ مێشومۆرە قەبارێ وێ هندی یێ مشکەکی یە و کەفیتە بەر گەفێن ڤرکرنێ ؟

مێشا "ویسا" مێشومۆرەکا مەزنە و یا بێ پەرە, قەبارێ وێ سێ جارا هندی یێ مشکەکی یە, ئەڤ بونەوەرە کەفیتە بەر گەفێن ڤرکرنێ چونکی ئەو دارستانێن لێ دژیت ل وەلاتێ نیوزلەندا یێن هاتینە خرابکرن, ئەڤ چەندەژی بویە ئەگەر جرد ب سانەهی وان نێچیر بکەن, لێ خوشبەختانە نوکە ویسا ب ئارامی ل پاراستنگەهێن سروشتی دژیت.



دبیت "تەڤنپیرکێن سۆر" ب ترس بن, لێ چ زیانێ ناگەهینە مروڤان, لڤێ دوماهیێ ئەوژی یێن کێم بووین ب تایبەت پشتی مروڤ شیاین وان کەهی بکەن و ژ جهێ وان یێ رەسەن ئیناین.

دناڤ گومێن ئاڤێدا خوارنەکا باش بۆ وان باڵندەیان لێ هەیە یێن بێهنا خو لێ ڤەدەن, چونکی ئەو بۆ ماوەیەکێ درێژ دفڕن و ژ جهەکی بەرەڤ ئێکی دی کوچ دکەن.



# بوچی گیانەوەر حەز ژ گومێن ئاڤێ دکەن ؟



گومێن ئاڤێ جهەکێ ئارامە بۆ گەلەك بونەوەرێن ل سەر روویێ ئەردی و خوارنەکا باش لێ هەیە. لێ گوم نە پاراستنگەهێن سروشتینە, چونکی گەلەك ژ وان هاتینە هشکرن و ل شوینا وان خانی و باخچە لێ هاتینە دروستکرن, هەمی ئەو گیانەوەرێن دناڤ ڤان گوماندا دژین دێ مرن ئەگەر بەردەوام جهێن وان هاتنە خڕابکرن.

گومەکا ئاڤێ
ل ویلایەتا فلوریدا

غەزال

کیسەڵی دەریایێ

ماسیا لیۆن





دکەڤندا تیمساحێ ئەمریکی ژبەر پیستێ وێ یێ گرانبەها دهاتە نێچیکرن, لەورا ل سالێن شێستان کەفتبوو بەر گەفێن ڤرکرنێ, لێ پشتی هاتیە قەدەغەکرن نوکە هژمارا وان بەرەڤ زێدەبونێ یە.

# نێچیرڤان چەوا نێچیرا تێشکێن باڵندەیان دکەن

ل وەڵاتێ رۆسیا هندەك نێچیرڤان دێ بیکێن لاستیکی ل سەر شێوێ باڵندەیان کەنە دەستێ خو و دێ ماسکەکی ژی دانە سەر سەروچاڤێن خو ودێ چنە سەر وان گومێن ئاڤێ یێن باڵندە لێ هەین, تێشکێن باڵندەیان هزردکەن ئەڤ بیکێن لاستیکێ باڵندەیێن ژ راستانە لەورا دهێنە دەڤ وان, هوسا ئەو ڤان تێشکێن باڵندەیان نێچیر دکەن.

پەلاتینك

باڵندێ شاهێ خەمگین



حاجی لە لەق

وەردەکا هێلدار

ماسیا ئەریون

تیمساحێ ئەمریکی

## بوچی گەمی زیانێ دگەهینە چێلێن دەریایی ؟

چێلا دەریایی گیانەوەرەکێ هەژارە و پتریا دەمێ خو ب گەریاناڤە دبورینیت و گیاییێ دەریایی دخوت, لێ ژ بەخت ڕەشیا وان ئەو حەز ژ گەریانێن بتنێ ناکەن, ئەو گیانەوەرە دێ ل دویڤ وان گەمیان دکەڤن پێن بلەز دچن, لەورا گەلەك جاران دکەڤنە بەر پەروانێن گەمیان و پرت پرت دبن, ئەڤ چەندەژی بویە سەدەما کێمبوونا هژمارا وان.

ل چینێ دولفینێ روباران هەیە و کەفتیە بەر گەفێن ڤرکرنێ چونکی تا ڕادەیەکی یێ کورەیە و بۆ خوارنێ پشت بەستنێ دکەتە سەر دەنگان, لێ گەلەك جاران دەنگێ پاپوران وی د خاپینیت لەورا ب سانەهی دکەفیتە تۆرێن نێچیرڤانان.

## ئەرێ هێکێن ماسیا خیبار کیڤە دچن ؟

سالانە ماسیێن خیبار ژ دەریایی بەرەڤ روباران دچن داکو هێکێن خو لێ ب دانن, لێ گەلەك هێکێن وان نابنە ماسی چونکی مروڤ هێکێن وان نێچیر دکەت و خوارنەکا گرانبەها ژێ دروست دکەت دبێژنێ کافیار کو ل سەر پسکێتان دهێتە دانان.





# ئەگەر تە سەمەنکلێ ئەنکلیسی دیت نەبێژە کەسێ ؟



مروڤان بەردەوام هژمارەکا مەزن یا گیانەوەرێ "سەمەنکلێ ئەنکلیسی" دناڤ روبار و دەریایاندا دگرتن و دکوشتن هەتا وەلێ هاتی ئێدی کەسێ ئەڤ گیانەوەرە نەدیتنەڤە و یێن بەرزەبووین, لەورا ئەگەر تە ئەڤ گیانەوەر دیت نەکوژە و نەبێژە کەسێ داکو هژمارا وان زێدەبیت.

# چەوا ماسی نەخوشیان دگەهینە باڵندێ ئەلهووی ؟

ل ئەورووپا پیچەك مابوو سەیێ دەریایێ ژبەر پیسبوونا روباران ژناڤ بچیت, لێ خوشبەختانە پشتی هندەك روبار هاتینە پاقژکرن, ژیانا ڤان گیانەوەران ژی هاتە پاراستن.





دەمەکێ کێم بوو باڵندێ "ئەلهوویێ سەرحوچ" بەرەڤ نەمانێ بچیت ئەوژی ژبەر خوارنا ماسیێن ژەهراوی و دەرمانێن کوشتنا مێشومۆران ئەڤێن جوتیار ل ناڤ رەزو بیستانێن خو درەشینن. دەما باران دهات دا ڤی دەرمانی ژناڤ داروبار گەهینتە ناڤ روباران و پاشی دا چیتە دناڤ زکێ ماسیاندا و دا پێ ژەهراوی بن, لێ خوشبەختانە ئەڤروکە ب کارئینانا ڤان دەرمانان هاتیە قەدەغەکرن و هژمارا ڤان باڵندەیان ژی بەرەڤ زێدەبونێ یە.

ل هندەك پاراستنگەهێن سروشتی ل ئەفریقیا, زێرەڤان دێ شاخا ڤی گیانەوەری ژێڤەکەن چونکی چ ئێشان تێدا نینە و داکو نێچیرڤان ئێدی نێچیرا وی نەکەن و نەکوژن.

# ئەو کیژ گیانەوەرە شاخەك پێڤە هەی و نوکە کەفتیە بن گەفێن ڤرکرنێ ؟

گیانەوەرێ ئێکشاخ ل دەشتێن ئەفریقیا و ئاسیا دژیت, هەرچەندە نێچیرکرنا وی بەروڤاژی یاسایێ یە لێ هێشتا هندەك کەسێن ماین نێچیرا ڤان گیانەوەران دکەن ئەوژی ژبەر شاخا وی یا گرانبەها, ل هندەك دەڤەران شاخا وی دکەنە دەستکێ خەنجەران یانژی دهێرن و دکەنە دەرمان.



کیسەلەیێ ئەفریقی یێ سەر هشکاتی کەفتیە بن گەفێن ڤرکرنێ ژبەر هژمارەکا مەزن ژێ هاتینە نێچیرکرن و وەك گیانەوەرێن کەهی دهێنە فروتن. ئەڤ کیسەلە ب سانەهی دشێت ژ دوژمنێن خو ب ڕەڤیت و خو دناڤ بەران دا ڤەشێریت, لێ ئەڤ فێلا وێ هاریکاریا وێ ناکەت



## تو ل کیرێ دشێی وێنەیەکێ فوتۆگرافی دگەل فیلان بگری ؟

فیلی دوو کێلبێن گەلەك بهێز هەنە و ئەڤ چەندە بویە ئەگەر نێچیرڤان وان بکوژن و کێلبێن وان بفروشن, ل گەلەك وەلاتان نێچیرکرنا فیلان هاتیە قەدەغەکرن لێ تە مافێ هەی وێنەیەکێ فوتۆگرافی دگەل بگری, ئەو پارێ گەشتیار دەنە باخچێن گیانەوەران و پاراستنگەهێن سروشتی دهێتە دان بۆ کەسێن کو چاڤدێریا فیلان دکەن و نەهێلن نێچیرڤان وان بکوژن.

وەکی هەمی گیانەوەرێن دی, "باڵندێ چرگ" یێ مایە بێ جهێ ئاکنجیبونێ چونکی مروڤان جهێن وان ژێ ستاندینە و کرینە باخچە و بیستان, لەورا گیانەوەرێن دی ب سانەهی وی دخون یانژی گیانەوەرێن د سەرا دهێن و دکوژن.





## ئەو کیژ گیانەوەربوو پشتی قڕبووی دووبارە هژمارا وان زێدەبووڤە ؟



غەزالا "بیردافید" بەری نوکە ژناڤ چوبوون, لێ بتنێ هندەك مابوونە ل باخچێن گیانەوەران و چاڤدێریەکا باش لێ هاتە دکرن,لەورا خوشبەختانە ئەڤروکە هژمارا وان یا زێدەبووی و دوبارە هاتینە هنارتن بۆ وەلاتێ وان ل باکورێ چینێ.

ل دارستانێن هێلا کەمەرەیی هژمارەکا گەلەك مەزن و جودا یا گیانەوەر و داروباران هەیە کو ل دارستانێن دی هندە نینن, لێ برینا داران ژیانا ڤان گیانەوەرانێ ئێخستیە د مەترسییێ دا.

# بوچی مەیمینکێن مەزن حەز ژ داران دکەن ؟



مەیمینکا مەزن ل دارستانێن هێلا کەمەرەیی ل ئەفریقیا دژیت و پتریا دەمێ خو ل سەر داران دبورینیت و خو دڤەشێریت, لێ برینا داران ل ڤان جهان بوویە ئەگەر ئەڤ مەیمینکە وەکی بەری نەشێت ب سانەهی خو ڤەشێریت و ل خوارنێ بگەریت .

# ئەو کیژ گیانەوەرێ شەرمینە کەفتیە بن گەفێن ڤرکرنێ ؟



گیانەوەرێ بزنا زەرافە" گەلەکێ شەرمینە لەورا مروڤ ب زەحمەت وێ دبینیت, ژبەر هندێ هەتا سالا 1091 ژی زانایان ئەڤ گیانەوەرە نەدیتبوو, لێ ئەڤروکە هژمارا وانژی بەرەڤ کێمبوونێ چوویە ژبەر برین و سۆتنا دارستانێن دەڤەرا کەمەرەیی کو جهێ ئاکنجیبونا وانە.

# بوچی گیانەوەرێ یێ "ئای ئای" نەخوشیێ دگەهینتە مروڤان؟



گیانەوەرێ دهێتە نیاسین ب "ئای ئای" ل دارستانێن مەداگەشگەر ل دەڤەرا کەمەرەیی دژیت, ئەڤ گیانەوەرە ب شەڤێ ل خوارنێ دگەریت, ژبەر ڤێ چەندێ خەلکێ وان دەڤەران هزردکەت کو ئەڤ گیانەوەرە دێ نەخوشیێ گەهینتە وان لەورا دکوژن. نوکە هژمارا ڤی گیانەوەری ژی یا کێم بووی لێ هندەك ل باخچێن گیانەوەران هاتینە پاراستن.

هندەك نێچیرڤانێن دارستانێن هێلا کەمەرەیی ل دەمێ نێچیرکرنێ ژەهرا دناڤ لەشێ بەقاندا د سەرێ تیرکوڤانێن خو ددا, لێ ئەڤروکە ئەڤ جورێ بەقان ژی کەفتیە بن گەفێن ڤرکرنێ.



# ئەو کیژ ڕیڤیە دفریت هەتا خوارنێ ب دەستڤەدئینیت ؟



ڕیڤیێ "ڕۆدریگز" دبنەرەتدا نە ڕیڤیە, بەلکو جورەکێ چەکچەکیلانە ل گزیرتا ڕۆدریگز ل زەریایا هندی دژین, ئەڤ گیانەوەر گەلەك حەز ژ فێقی دکەن لەورا ئەو پێدڤی ب دارێن فێقی هەیە, لێ ژبەرکو پتریا دارێن فێقی لسەر گزیرتێ هاتینە برین لەورا ئەڤروکە هژمارا ڤی جورێ چەکچەکیلان ژ 400 دانەیان نابوریت.

## بوچی هرچا جەمسەرێ
## هێشتا مایە د مەترسیێ دا ؟



ل بەرێ نێچیرڤانان هرچا جەمسەری ژبەر فەرۆیێ وی دکوشت لێ پشتی هینگێ ئەڤ چەندە هاتە قەدەغەکرن, لێ بلندبوونا پلا گەرماتیا ئەردی بویە ئەگەر هێدی هێدی بەفرا ل جەمسەری ب حەلییێت و ژینگەها وان ژی پیس بیت, لەورا جارەکا دی ئەڤ هرچە کەفیتنە د مەترسیێ دا و ب سانەهی نەشێت بۆ خو ل خوارنێ بگەریت.



## بوچی مروڤ فەریێ فەقمان
## بویاغ دکەن ؟

ل هندەك دەڤەرێن جەمسەری ل وەلاتێ کەنەدا نێچیرڤان گیانەوەرێ فەقمی ژبەر فەرۆیێ وی یێ سپی و وەکی بەفرێ نێچیردکەن, لێ ئەو کەسێن ب ئەرکێ پاراستنا ڤان گیانەوەران رادبن, دێ فەرۆیێ ڤان گیانەوەران بۆیاغ کەن. ئەڤ کریارە چ زیانێ ناگەهینتە فەقمان لێ دبیتە ئەگەر ئێدی نێچیرڤان چ مفای ژ فەرۆیی نەبینن.



ل هندەك وەلاتان دەمێ هرچا جەمسەری بۆ خو ل خوارنێ دگەریت, مەترسیێ ل سەر ژیانا خەلکێ وان دەڤەران پەیدادکەت لەورا خەلك نەچار دبیت ڤان هرچان بکوژن. ئەڤروکە پتریا ڤان هرچا هاتینە ڤەگوهاستن بۆ جهەکێ ئارامتر و دوور ژ خەلکی.



بەری نوکە مروڤان "گاییێن سەمك" دکوشتن ژبەر گوشتێ وان, لێ پشتی هینگێ بۆ وان دیاربوو کو ئەو پارەیێ ژ فەروییێ وان یێ ستوور و نەرم دگەهیتێ پترە ژ وی پارەیێ ژ گوشتێ وان ب دەستڤە دئینن لەورا وان کوشتنا گایان هێلا و نوکە چاڤدێریا وان دکەن و ب خودان دکەن.



## ئەو کیژ نەهەنگێ خودان شاخە و کەفتیە بەر گەفێن قڕکرنێ ؟

"حەریش" ئەو نەهەنگە یێ دناڤ دەریاییێن جەمسەرێ باکوری دژیت, نەهەنگێ نێر شاخەکا لێکبادایی یا هەی لەورا ئەڤ گیانەوەرەژی ژبەر دەستێن نێچیرڤانان قورتال نەبویە و گەلەك ژێ هاتینە کوشتن هەتاکو هژمارا وان کێم بووی.

ئەو گیانەوەرێن ل جەمسەرێ باشورێ گویا ئەردی دژین نەکەفتیە بەر وان زیانان یێن مروڤی گەهاندینە گیانەوەرێن دەڤەرێن ل سەر روویێ ئەردی, ژبەر ڤێ چەندێ گیانەوەرێن ل وێرێ نەکەفتینە بەر گەفێن ژناڤچوونێ.



# بوچی مروڤ "نەهەنگێ گونجای" نێچیردکەن ؟

گەلێ ئەندیت" ل جەمسەرێ باکوری هێشتا نەهەنگێ گونجای نێچیردکەن و ئەو بۆ ڤێ چەندێ پێن هاتینە دەستیردان ژبەرکو ئەڤ چەندە ئێکە ژ دابونەریت و رەوشتێن وان, لێ زانا هەولدەن رادەیەکی بۆ ڤێ چەندێ ب دانن.

نەهەنگێ گونجای ناڤێ خو ژ وان نێچیرڤانان وەرگرتیە پێن دگوتی کو ئەڤ نەهەنگە یێ گونجایە بۆ نێچیرکرنێ ژبەرکو گەلەك هەستیك و زەیت یا دناڤ لەشێ ویدا هەی, راستە بەری پتر ژ 70سالان بریارا قەدەغەکرنا نێچیرکرنا وان هاتیەدان لێ تانوکە ژی هژمارا وان گەلەك کێمە.



گەمیێن نێچیرکرنێ هژمارەکا مەزن یا ماسیان نێچیردکەن کو گەلەك جاران ژی ئەڤ هژمارا مەزن یا زێدەیە, لەورا دبیت رۆژەك بهێت ماسی ژی بکەڤنە ژێر مەترسیا ژناڤچونێ.





هەرچەندە مروڤ ژ ماسیا قرش دترست, لێ دراستی دا ئەڤ ماسیە پتر ژ مروڤان دترسیت ژبەرکو سالانە هژمارەکا مەزنا ڤان ماسیان دهێتە نێچیرکرن ئەوژی ژبەر ددانێن وان کو وەك جوانکاری دهێنە ب کارئینان.





هندەك جاران كومەكا مەزن یا "ستێرێن دەریایی" یێن خودان ستری دێ ل سەر ئێك كومبن داكو ب سانەهی بشێن مەرجانان بخون, لێ ئەڤ چەندە هاریكاریا نێچیرڤانان دكەت هژمارەكا مەزن یا ڤان ستێرێن دەریایی نێچیر بكەن.

# ئەرێ باخچە دناڤ دەریایان دا هەنە ؟



تا نوكە دبیت مە بتنێ باخچەیێن سەر ئەردی دیت بن, لێ هژمارەكا مەزن یا باخچە و پاراستنگەهێن سروشتی دناڤ دەریایاندا هاتینە دورست كرن ژ پێخەمەت پاراستنا گەلەك جورێن گیانەوەران وەك مەرجانێن هەستیار. مەزنترین باخچە ل سەر كنارێن ئوسترالیا هاتینە دروستكرن و كەسێ ماف نینە زیانێ بگەهینتێ.

سالانە ب ملیونەها بونەوەر ل سەر هشكاتی و دناڤ ئاڤێ دا دمرن ژبەر خوارنا وان بەرمایكێن ژ پلاستیكی هاتنە دروست كرن, بۆ نموونە گەلەك جاران كیسەلە نایلونێن پلاستیكی دخوت چونكی یا ژوێڤە ئەڤە قەندیلێن دەریایێ نە.





# بوچی بەبەغا ناهێنە هژمارتن ژ گیانەوەرێن کەهی ؟



بەبەغا گیانەوەرەکێ گونجایی نینە کو بهێتە کەهیکرن چونکی ئەو یێ ژدایك بووی دا یێ کیڤیی بیت, سالّانە ب هزارەها بەبەغا ژ جهێ وان یێ رەسەن دهێنە گرتن و دناڤ سندوقێن بچوك و تەنگدا دهێنە فروتن لەورا پتریا وان گیانێ خو ژ دەست ددەن.



ئەو گیانەوەرێن دهێنە گرتن و پاشی مروڤ ب خودان دکەت کێمتر دمینە ساخ ژ وان یێن هەر ل دەمێ ژدایك بوونا وان ل دەڤ مروڤی, لەورا ئەگەر تە ڤیا گیانەوەرەکی بخودان بکەی خو ژێ پشت راست بکە کو نەهاتیە گرتن.



بالّندێ بەبەغایێ ئەمریکی ژ جورێ "سبیکس" گیانەوەرەکێ گەلەك گرانبەهایە لێ نوکە هژمارا وان ژ 30 دانەیان نابوریت لەورا ئەگەر ئەڤ گیانەوەرە خو زێدە نەکەن ئەوێن ماین ژی دێ مرن.

یا گرنگە تو قەبارە و ژیێ گیانەوەرێن کەهی بزانی بەری تو بکری, ژبەرکو گەلەك مروڤ دەما گیانەوەرەکی دکرن ماوەیەکێ کێم دمینە ل دەڤ وان و زوویکا دمرن.



## کی دێ مارگیسکان کەتە دناڤ چانتێن خودا ؟



ل فرۆکخانەیان گەلەك کەس دهێنە دەستەسەرکرن ژبەرکو ئەو مارگیسکان دکەنە دناڤ چانتەیێن خودا, یاسا رێکێ نادەت گیانەوەرێن کەفتینە بەر گەفێن قرکرنێ ژ وەلاتەکی بۆ ئێکی دی بهێنە ڤەگوهاستن, ڤان کەسان هەول ددا مارگیسکان ببەنە وەلاتێ خو.



گەلەك جاران زانا هندەك جورێن مەیمینکان ب خودان دکەن داکو دەرمانێن نوو ل سەر تاقی بکەن, هندەك دبێژن ئەڤ چەندە یا گونجایە داکو ساخلەمیا وان دەرمانان بۆ مروڤی دیاربیت, هندەکێن دی دژی ڤێ چەندێنە ژبەرکو سەرەدەریەکا رەق گەل ڤان گیانەوران دهێتەکرن.



# چەوا دێ فیل ژ نێچیرڤانان هێنە پاراستن ؟

بەری چەند سالان, شاهێ وەلاتێ کینیا ڕابوو ب سوتنا هژمارەکا کێلبێن فیلان کو بهایێ وان نێزیکی ملیونەك و نیڤ جونەیهێن ئیستەرلینی بوو, حکومەتێ ئەڤ کێلبە ژ نێچیرڤانان ستاندبوون.
ب ڕێکا سوتنا ڤان کێلبان وەلاتێ کینیا ڤیا بۆ جیهانێ دیاربکەت ئەو ب هەمی ڕەنگان دژی نێچیرکرنا گیانەوەرانە و ڤیا باوەرییێ بۆ وەلاتێن دی چێکەت کو ئەوژی هاریکاریا وان بکەن و پێکڤە هەمی شیانێن بێخنە خزمەتا پاراستنا گیانەوراندا.



# چەوا دووپشکێن لاستیکی دهێنە گرتن ؟

دووپشکێن لاستیکی ل گزیرتێن زەریایێن ئارام و زەریا هندی دژین, درێژاهی و فرەهیا هندەك ژڤان گیانەوەران دگەهیتە مەترەکێ, لێ مخابن نێچیرڤانان دەستێ خو گەهاندیە وانژی و گەلەك ژێ نێچیرکرینە.



درێژاهیا گیانەوەرێ سەلەمەندەرێ چینێ دگەهیتە 180 سانتیمەتران, هژمارا وان کەسێن حەز ژ گوشتێ ڤی گیانەوەری دکەن گەلەکن لەورا ئەڤروکە ئەوژی کەفتینە بەر گەفێن نەمانێ.

# بوچی پلنگی نەڤێت مروڤ وی ببینن ؟



هندەك مروڤ حەزدکەن وان جلکان بکەنە بەر خو یێن ژ پیستێ پلنگێ خالخال هاتینە دروستکرن, لێ هندەکێن دیژی بۆ خو خوشیێ ژ نێچیرکرنا ڤێ کێتکا مەزن دبینن. ئەگەر پلنگ شیابا ئاخفتبا دا بێژیت خوزی من ئەڤ پیستێ جوان نەبا داکو بەس مروڤان دلێ خو بربایێ و سەر خاترا وی ئەز کوشتبام.

# چەوا پلنگ خوارنێ بۆ خو پەیدادکەت ؟

ل وەلاتێ هندێ گەلەك پلنگ یێن ل باخچێن گیانەوران و پاراستنگەهێن سروشتی هەین و ب ئازادی لێ دژین، بەلێ ئاریشە ئەوە ئەڤ باخچەیە ژێك دوورن.
لێ دناڤبەرا واندا هندەك جهێن تیرابورینێ هەنە کو پلنگ ب کاردئینیت بۆ دیتنا هندەك هەڤالان یان خوارنێ.



# چەوا گیانەوەرێ ئوبوسوم دگەهیتە هەڤالێن خو ؟

گیانەوەرێ "ئوبوسومێ بەژن کورتێ چیایی" ل وەلاتێ ئوسترالیا دژیت، ئەڤ گیانەورە رێکێن بن ئەردی ب کاردئینیت. پشتی کو پاراستنگەهێن سروشتی هاتینە دروستکرن گەلەك توخمێن نێر توشی روودانێن مرنێ دبوون هەردەما ڤیابا بچنە دەڤ یێن مێ .



گزیرتا "گالاباکوس" ل گزیرتا ئارام وەڵاتەکێ باشە بۆ گیانەوەر و ڕوەکان ژبەرکو گەلەك بونەوەر ل ڤێ گزیرتێ هەنە کو ل چ جهێن دی نینن لەوڕا نوکە بویە باخچەیەکێ نیشتیمانی یێ مەزن بۆ پاراستنا ژیانا گیانەوەرێن کیڤی.

## بوچی ل بەرامبەر گورێلایێ تو نەشێی بێهنژی ؟

گورێلا چیایی ل پاراستنگەهێن سروشتی ل سەرێ چیایێن فیرۆگینا ل ئەفریقیا دژین, گەشتیار دشێن سەرەدانا وان بکەن, لێ ئەڤ گیانەورە خو ل بەر نەساخییێن مروڤان ب تایبەت ژی پەرسیڤی ناگریت چونکی پەرسیڤ دبیتە ئەگەرێ مرنا وی, بۆ پاراستنا وان دڤێت تو یێ ساخلەم بی داکو بشێی سەرەدان وان بکەی.



هەرچەندە نێزیکی 4000 پڵنگان ل وەڵاتێ هندێ ماینە لێ هێشتا نێچیرڤان وان دکوژن, ئەوژی ژبەر فروشتنا کێلب و هەستیکێن وان بۆ دروستکرنا دەرمانان, هەروەسا فەرۆیێ ژی وان پارەیەکێ گەلەك مەزن پێڤە دهێت.



# کەنگی گیانەوەران
## دڤێت بچنە باخچێن گیانەوەران ؟

بەری نوکە باخچەیێن گیانەوەران بتنێ بۆ هندێ بوون داکو خەلك بچیت تەماشەی وان بکەت, دبیت هندەکا هزرکربیت کو ئەڤ گیانەوەر بتنێ نە و کەس چاڤدێریا وان ناکەت. لێ ئەڤروکە پتریا باخچەیێن گیانەوەران هەوڵ دەن ژیانا وان گیانەوەران پارێزن یێن کەفتینە بەر گەفێن قڕکرنێ, ئەگەر گیانەوەرا ئاخفتبا دا بێژن مە بەنە ڤان باخچەیان داکو نێچیرڤان باڵا خو ژ مە ڤەکەن.



# کەنگی گیانەوەران
## دڤێت ژ باخچێ گیانەوەران بچن ؟

دوماهیك گیانەوەرێ چێلا کوویڤی یێ ئەرەبی (غزلان) ل ساڵا 1972 هاتبوو کوشتن, لێ خوشبەختانە هندەك ژوان هاتنە قورتالکرن و ل باخچەیان هاتنە ب خودان کرن هەتا هژمارا وان زێدەبووی و گەهشتیە 100دانەیان و ئەڤروکە ب ئازادی ل بیانا وەلاتێ عومان دژین.

بەری پتر ژ هەشتێ سالان پیچەك مابوو گیانەوەرێ "هامستەرێ زێرین" ب ئێکجاری ژناڤ بچیت, لێ گیانەوەرەکا مێ دگەل دوازدە تێشکێن وێ هاتنە قورتالکرن و خودانکرن کو ئەڤروکە هژمارا وان گەهشتیە ملیون دانەیان.



# ئەو کیژ گیانەوەرە د مەنجەلوکاندا دهێتە ب خودانکرن ؟



گیانەوەرێن خشوك ژ جورێ "بایبی کەمب" ل باخچەیێن تایبەت ل وەلاتێ ئەمریکا دهێنە بخودانکرن, ئەڤ گیانەوەر دناڤ هندەك مەنجەلوکاندا دهێنە بخودانکرن کو نێچیرڤان و باڵندە نەشێن بگەهنێ, پشتی هژمارا وان زێدەبووی کو ئەو ب خو شیاین پشت بەستنێ بکەنە سەر خو یێن هاتینە ڤەگوهاستن بۆ ناڤ زەریایی دا.



هوسا دهاتە هزرکرن کو کەنگەر یێن ژناڤچووین, لێ ل سالا 1973 کومەکا کەنگەران ل دەڤەرا "دیگو" ل ئوسترالیا هاتنە دیتن, ئەڤروکە ئەو جهـ بویە پاراستنگەهەکا سروشتی و گەلەك کەنگەر ب ئازادی لێ دژین .

# بوچی گیانەوەر پێدڤی مەنە ؟



گەلەك جاران گیانەوەر دکەڤنە بەر گەفێن مەترسیا ژناڤ چوونێ ئەوژی ئەگەرێ وان کارێن هندەك نێچیرڤان دگەل وان دکەن. گیانەوەر نەشێن باخڤن لەوڕا ئەو پێدڤی ب هندەك مروڤێن باشن داکو پێش وانڤە باخڤن و مافێن وان بپارێزن, ئەڤروکە گەلەك رێکخراو و مروڤان ل سەرانسەری جیهانی ئەڤ کارە ب ستویێ خوڤە گرتیە.

گەلەك کەسان کارێ خو کریە پاراستن و چاڤدێریکرنا وان گیانەوەرێن کەفتینە بەر گەفێن ژنافچوونێ, لەوڕا هەر مەترسیەکا بچوك پەیدابیت ئەو دێ هەمی شیانێن خو مەزێخن داکو ڤان گیانەوەران قورتال بکەن.




هەر کەسەك ژمە دشێت هاریکاریا گیانەوەران بکەت داکو بهێن پاراستن, ئەوژی ئەم پەیوەندیێ ب وان جهان بکەین یێن ب ڤی ئەرکی ڕادبن, هەردیسان ئەم گیانەورەران ب پارێزین و نەئێشینین و دەما دچینە گەریانان ژینگەها وان پیس نەکەین.



# بوچی
# ئەم پێدڤی ب
# گیانەوەراینە ؟

هندەك گیانەوەر ژێدەرێ سەرەکی یێ
خورانا مروڤینە, زێدەباری پیست و فەرۆیێ
وانژی بۆ گەلەکان مەرەمان دهێتە ب کارئینان,
ئەگەر گیانەوەر نەبان, ل وی دەمی ئەم دا نەچاربین
کەسکاتی بتنێ بخوین. هەردیسان گیانەوەرانان ب هەبوونا
خو روویەکێ جوانتر و گەشتر یێ دایە ژیانێ.





گیانەوەرانژی وەکی مە ماف یێ هەی ب ئازادی و
تەناهی و خوشی بژین, لەورا نابیت ئەم زیانێ
بگەهینە وان یانژی ژینگەها وان پیس بکەین
یانژی جهێ ئاکنجیبونا وان خراب بکەین
و بۆ مەرەمێن خو ب کاربینین.

چەوا دێ فیل ژ نێچیرڤانان هێنە پاراستن ؟
بوچی دەیناسۆر نەمایە ل سەر روویێ ئەردی ؟
بوچی هرچا جەمسەرێ هێشتا مایە د مەترسیێ دا ؟
ئەو کیژ گیانەوەرێ شەرمینە کەفیتە بن گەفێن قڕکرنێ ؟
ئەو کیژ گیانەوەربوو پشتی قڕبووی دووبارە هژمارا وان زێدەبووڤە ؟

بەرسڤا ڤان پرسیاران و چەندین پرسیارێن دی یێن پەیوەندی ب وان گیانەوەرێن قڕبووین یانژی یێن کەفتیە بەر گەفێن قڕکرنێ و هێدی هێدی یێ بەرەڤ نەمانێ دچن دێ د ڤێ پەرتوکێ دا بینی, بەرسڤا ڤان پرسیاران ب شێوەیەکێ زانستی یێ گەلەك سادە و ئاسان هاتینە بەرهەڤکرن هەتا زاروویێن دژیێ شەش سالیێ دا دشێن تێبگەهن, زێدەباری کو هژمارەکا مەزن یا وێنەیێن گیانەوەران تێدا هەنە و ب شێوەیەکێ کومێدی یێ سەرنجراکێش بەرسڤا ڤان پرسیاران ب سانەهیتر لێ دکەن. هەردیسان ئەڤ پەرتوکە یا پڕە ژ شیرەت و پێزانینان کو دبیتە ئەگەر ئێدی حەزا زارووی بۆ گیانەوەران پتر لێ بهێت و هەڤالینیا وان بکەت.
پشتی تو ژ خواندنا ڤێ پەرتوکێ ب دوماهی دهێی ئێدی حەزا تە بۆ گیانەوەران دێ پتر لێ هێت و ب چ رەنگان تو زیانێ ناگەهینە وان و دبیت تو بریارێ بدەی ل پاشەرۆژێ ببیە ئێك ژ وان کەسان یێن ئەرکێ پاراستنا گیانەوەران ژ قڕکرنێ ب ستویێ خوڤە بگرن.

